زنجیرەی چیرۆکە قورئانیەکان
(2)

# ووشترە خواییەکە





ن / منصور علي

و / زانا كريم

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی زنجیره: زنجیرەی چیرۆکە قورئانیەکان

ناوی پەرتوک: ووشترە خواییەکە

نوسینی: منصور علی

وەرگێڕانی: زانا کریم

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

تایپ و دیزاین: کۆمپویتەی یاد

ژمارەی سپاردن: ژمارەی (١٣٨٠)ی ساڵی (٢٠٠٩)

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی (مەحوی)

هەولێر/بازاری ڕۆشنبیری





بسم الله الرحمن الرحيم

# دەستپێک

زۆرینەی کات کە خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە یارمەتی داون بە شتی سەیرو سەمەرە کە پێیان دەوترێت (موعجیزە)، ئەو موعجیزانە بۆ پێغەمبەران بوونەتە مایەی ڕاستگۆییان و گەورەیی و فراوانی دەسەڵاتی پەروەردگار.

ووشترەکەی پێغەمبەر ساڵحیش سڵاوی خوای لەسەربێ یەکێکە لەو موعجیزە سەیرو سەرسوڕهێنەرانە کە خوای پەروەردگار بەهۆیەوە ڕاستگۆی ئەو پێغەمبەرەی ئاشکرا کرد، ئەمە لەکاتێکدا کە قەوم و گەلەکەی ئەو پێغەمبەرە دڵسۆزەیان بە ناتەواوو درۆزن دەدایە قەڵەم.

لەم پەرتوکە دا گەشتێک دەکەین بە ناو باسەکانی ئەو ووشترەدا، وە هەوڵ دەدەین زیاتر ئاشنا ببین بە گەورەیی و بەهێزی دەسەڵاتی پەروەردگار، وە هەوڵ دەدەین بزانین گەلەکەی پێغەمبەر ساڵح ناویان چی بوو؟ وە لەکوێ دەژیان؟ وە چیان بەسەرهات؟



# بانگەواز ... ڕێنمونی

لە ناوچەیەکی عەرەبیدا کە ناو دەبرا بە (حیجر) لەنێوانی حیجاز و تەبوکدا گەلێک لەناویدا دەژیان کە پێیان دەووترا: گەلی سەموود، ئەم گەلە کۆمەڵانێکی زۆر بەهێزو بە توانابوون لە جەستەو لە هێزدا و بۆ خۆیان خەریکی ژیان بوون، بەڵام ژیانێکی پڕ لە خورافات و بێ باوەڕی، وە ئەوەندە بەهێزو خاوەن توانابوون کە شاخەکانیان کون دەکردو ژیانیان تێدا دەبردەسەر، وە لەباتی ئەوەی لەسەر ئەو هەموو نیعمەتانەی کە خوا پێی دابوون سوپاسی خوای لەسەربکەن و هێزەکانیان لە شتی دروستدا سەرف بکەن خۆیان خەریک دەکرد بە کاری نارەواو پۆخڵەواتەوە، وە هەمووکات خۆیان خەریک دەکرد بە دروستکردنی بت و پەیکەرەوەو سوجدەو کڕنوشیان بۆ دەبردن، وە لەگەڵ ئەمانەشدا هەمووکات خەریکی بڵاوکردنەوەی فەسادو گەندەڵی بوون لەسەر زەویدا و خەڵکیان هاندەدا بۆ کاری خراپ و نارەواو بێ سوود، هەموو لایەکیشمان ئەو ڕاستی یە دەزانین کە پەروەردگار هیچ گەل و هۆزێک سزا نادات تاوەکو ئاگادارکەرەوەیەکیان بۆ نەنێرێت، ئەوەبوو خوای گەورەش هەر لەناوخۆیاندا کەسێکی هەڵبژاردو کردی بە پێغەمبەر، ئەم کەسە پێشتر لەناو خەڵکەکەدا بە کەسێکی ڕاستگۆو دەستپاک و لەخواترس ناوی دەبرا، ئەو کەسەش ناوی (سالحی کوڕی



عوبەید) بوو سڵاوی خوای لێ بێ، هەر لەگەڵ یەکەم ڕۆژی بوونی بە پێغەمبەر دەستی کرد بە ئامۆژگاریکردنی خەڵکی ئەو ناوچەیەو پێی دەفەرموون: ئەی خەڵکینە تەنها خوا بپەرستن و بەندایەتی و کڕنوش تەنها بۆ ئەو ببەن و نەکەن کەسێکی تر بێجگە لە خوا بە پەروەردگاری خۆتانی بزانن، وەکو پەروەردگارمان دەفەرموێت ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾ الأعراف (٧٣)

واتە: بۆسەر قەومی (ثمود)یش (صالح)ی برایانمان نارد (ئەویش پێی وتن): ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن چونکە جگە لەو خوایەکی ترتان نیە.

وە هەمووکاتێک بیری دەخستنەوە کە ئێوە نیعمەتێکی زۆری خواتان بەسەرەوەیەو پێویستە لەبەرامبەردا سوپاسی بکەن و لەبەرامبەریشدا بە تەنهایی بیپەرستن، پێی دەفەرموون ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ﴾ هود (٦١)

واتە: (ئەی گەلەکەم تەنها خوایە) بەرپای کردون لە زەویداو داوای لێکردوون کە ئاوەدانی بکەنەوە، جاکە وابوو داوای



لێخۆشبوونی لێ بکەن پاشان بگەڕێنەوە بۆلای و فەرمانەکانی بەجێ بهێنن, چونکە بەڕاستی پەروەردگاری من زۆر نزیکەو نزا وەرگرە (لەو کەسانەی لێی دەپاڕێنەوەو داوای لێخۆشبوونی لێدەکەن).

کە خەڵکەکە ئەم قسانەیان لێ بیست کەوتنە گاڵتە پێکردن پێی و تۆمەتی زۆر نابەجێ و ناماقوڵیان بۆ هەڵدەبەست و بە گومڕاو سەرلێشێواو و خەڵەفاو ناویان دەبردو بانگیان دەکرد, وە زۆر بە لوت بەرزیەوە بەو پێغەمبەرە ئازیزەیان دەوت ﴿قَالُواْ يَـٰصَـٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَـٰذَآ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ﴾ هود (٦٢)

واتە: ئەی صالح بەڕاستی پێش ئەم باسانەت تۆ لەناو ئێمەدا شوێنی هیوامان بوویت, ئایا بەرگری ئەوەمان لێدەکەیت کە شوێن شتێک نەکەوین کە باوو باپیرانمان شوێنی کەوتوون و پەرستویانن؟! ئێمە بەڕاستی لەگوماندائین لەوەی کە تۆ بانگی ئێمە دەکەی بۆلای و بەدبینین لێی!.

ئەم پێغەمبەرە دڵسۆزە گوێی نەدەدایە قسە ناخۆشەکانیان و بەردەوام بوو لەسەر بانگەوازو ڕێنموویی کردنیان بۆ شارێگەی ئیسلام و, بە جوانترین شێوازو بە جوانترین ووتە بانگی دەکردن و ئامۆژگاری دەکردن, وە هەموو کاتێکیش پێی ڕادەگەیاندن کە من



لەلایەن خواوە ڕەوانەکراوم و پێغەمبەری خوام، وەک پەروەردگارمان بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿إِنِّي لَكُمْ
رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ
مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا
هَاهُنَا آمِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ
طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا فَارِهِينَ
﴿١٤٩﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾
الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ الشعراء (١٤٣-١٥٢)

واتە: بەڕاستی دڵنیابن کە من فرستادەیەکی ئەمین و دڵسۆزم بۆتان. کەوابوو لەخوا بترسن و فەرمانبەرداری من بکەن من داوای هیچ جۆرە پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەری، من تەنها پاداشتی خۆم لە پەروەردگاری جیهانەکان دەخوازم.

ئایا وادەزانن هەروا ئالێرەدا بەخۆشی و ئاسودەیی دەهێڵرێنەوە (ژیانتان کۆتایی نایەت)؟ لەناو باخ و باخات و کانیاوی سازگاردا؟ لەناو بێستان و دارخورمادا کە خورمای نەرم و ناسک و بەتام دەگرێت؟ (هەروەها بۆتان دەلوێت)ماڵ و شوێنی خۆش لە



چیاکان دا بتاشن و بەجوانی دروستی بکەن و بەخۆشی تیایدا کەشخە بکەن؟ لە خوا بترسن و فەرمانبەرداری من بکەن.

بە فەرمانی موسریف و لە سنوور دەرچووەکان هەڵسوکەوت مەکەن ئەوانەی کە تۆوی فەسادو تاوان لە زەویدا دەچێنن و هەرگیز چاکسازی ناکەن.

بەم شێوەیە ئەو پێغەمبەرە ئامۆژگاری دەرکردن و بانگی دەکردن, بەڵام بەداخەوە ئەوان ئەو ئامۆژگارییە جوان و بەسودانەیان نەدەبیست و ڕۆژ بەڕۆژ کەللە ڕەقی و بێ باوەڕیان زیادی دەکردو ئەو پێغەمبەرەیان تۆمەتبار دەکرد بە ناتەواو و بە زمانە ژەهراویەکانیان دەیانوت:

﴿أَبَشَرًا مِّنَّا وَاحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ﴾ القمر (٢٤-٢٥)

واتە: باشە ڕەوایە ئێمە شوێنی تاکە کەسێک بکەوین لە خۆمان؟ ئێمە ئەگەر بڕوا بە کەسێکی وا بکەین, ئەوکاتە ئێمە بەڕاستی لە گومڕایی و شێتیدایین؟! ئایا ڕاستە لەنێوان ئێمەدا وەحی و نیگا بۆ ئەوڕەوانە کرابێت, نەخێر شتی وا نابێت, بەڵکو ئەو هەر کابرایەکی زۆر درۆزن و خۆپەرستەو حەز بە گەورەیی دەکات..



# بەڵگەی ڕاستەقینە

قەومی سەمود بەردەوام دەیانویست پێغەمبەر ساڵح لە بانگەوازەکەی سارد بکەنەوەو وای لێ بکەن بێدەنگ بێت, بۆیە ڕۆژێک هەموو بێ باوەڕەکان لە شوێنێکدا کۆبوونەوە تاوەکو پیلانێک دابنێن بۆئەوەی ئەو سەروەرە جارێکی تر نەڵێت من پێغەمبەرم و لەلایەن خواوە نێردراوم, دوور لەوەی کە نەیاندەزانی کە خوای باڵادەستی جیهانەکان بە سەرپەرشتی ئەمی ناردووەو کردویەتی بە پێغەمبەر, پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر ووتیان: ئەگەر تۆ ڕاست دەکەیت و دەڵێیت من نێردراوی خوام دەمانەوێت ئالەو بەردە گەورەیەوە ووشترێکی قەڵەوی سووری جوانمان بۆ دەربهێنیت, ئاماژەیان کرد بۆ بەردێکی زۆر گەورە کە لەو ناوچەیەدا بوو لە نزیک شاخێک, پێغەمبەر ساڵحیش سڵاوی خوای لێ بێ فەرمووی: ئەی خەڵکینە دابەزاندنی ئایەت و بەڵگەیەکی لەو شێوەیە کارێکی زۆر دژوارەو لەسەرمان دەکەوێت, چونکە ئەگەر ئایەتێکی لەو شێوەتان نیشاندراو پاش ئەوەش هەر بەردەوام بوون لەسەر سەختی و بێباوەڕی ئەوە ئەوکات هیچ شتێک سوودتان پێناگەیەنێت جگە لە سزای خوایی نەبێت, بۆیە ئەی خەڵکینە ئامۆژگاریتان دەکەم شوێنی هەواو ئارەزووەکانتان مەکەون و من



هەرگیز شتێکتان پێناڵێم کە ڕاست نەبێت و من دڵسۆزی ئێوەم و چاکەو بەختەوەری ئێوە مەبەستمە...

وە ئەگەر بەڵگەشتان دەوێت لەسەر بوونی خوا ئەوا سەیری ئەو شتانە بکەن کە لەبەرچاوتاندایە لە زەوی و ئاسمانەکان و ئاژەڵ و باڵدارەکان و دەریاکان و خشۆکەکان و خۆتان و .... هتد

بەم شێوەیە ئەم پێغەمبەرە بەسۆزە ئامۆژگاری بۆ دەکردن و ووتاری بۆ دەدان، بەڵام بێ سوود بوو چونکە ئارەزووەکانیان زاڵ بوو بەسەر ژیریياندا، ئەوسا بەو نێردراوەی خوایان ووت ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ الشعراء (١٥٣-١٥٤)

واتە: وا دیارە بەڕاستی تۆ لەوانەیت کە فێڵ و جادوت لێکراوە!

تۆ جگە لەوەی کە هەر بەشەرێکی وەکو ئێمەی هیچی ترنیت، بەڵگەیەکمان نیشان بدە ئەگەر لە ڕاستگۆیانیت؟!

پێغەمبەر ساڵح زانی کە قسەکردن سوودی بۆیان نی یە، بۆیە فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئەگەر ئەو شتەی دەتانەوێت پەروەردگار بۆی بەجێ هێنان ئیتر من بەدرۆناخەنەوەو بڕوا دەهێنن بە خوا و



وازيش دێنن له پەرستنی بت و پەیکەرەکان و تەنها کڕنوش و سوجدە بۆ پەروەردگار دەبەن؟

خەڵکەکەش له وەڵامدا ووتیان: بەڵێ, ئەگەر تۆ ئەو داوایەمان بۆ بکەیت له خواکەت و ئەویش بۆمان جێ بەجێ بکات سەرەنجام ئێمەش بڕوادەکەین و موسڵمان دەبین,

پێغەمبەر ساڵەحیش سەلامی خوای لەسەربێ چووە شوێنی نوێژکردنەکەیەوە و پاڕایەوەو ووتی: پەروەردگارا ئەمانە بەڵێنیان پێداوم ئەگەر تۆ ئەو داوایان بۆ جێ بەجێ بکەیت ئەوا ئیمانت پێ دەهێنن, ساخوایە داواکەیان بۆ بهێنەرە دی...






## دەرچوونی ووشترەکە

پاش دوعاکەی پێغەمبەر ساڵح هەموویان سەیری بەردە گەورەکەیان دەکرد و چاوەڕێ بوون, پاش ماوەیەکی زۆر کەم بە فەرمانی خوای باڵادەست بەردە گەورەکە پارچە پارچەو هەپرون بە هەپرون بوو, ئەوسا لە نێوەندی ئەو بەردە وە ووشترێک بە فەرمانی خوای گەورە دەرپەڕییە دەرەوە, وەک پەروەردگارمان لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّا مُرۡسِلُواْ ٱلنَّاقَةِ فِتۡنَةً لَّهُمۡ فَٱرۡتَقِبۡهُمۡ وَٱصۡطَبِرۡ﴾ القمر (٢٧)

واتە: بێگومان ئەو ووشترەی کە بیانوویان گرت, لە بەرد پەیدامان کرد, بەوەش تاقیمان کردنەوە, جا- ئەی ساڵح- چاودێریان بکە, بزانە چی دەکەن, خۆگرو ئارامگریش بە (لەبەردەم کاروکردەوەی ناشرینیانەوە)

لەبەرامبەر ئەم موعجیزە گەورەیەدا دەستبەجێ خێرا هەندێکیان ئیمان و باوەڕیان هێنا, بەڵام ئەوانی تر بێباوەڕییەکانیان زیاتر تۆخ بووەوە و ئەمجارەیان ئەو پێغەمبەرەیان بە ساحیرو کاهین ناوبردو دەیانوت چاوبەستمان لێدەکات و شتەکانی هەمووی سیحرو درۆیە ..



# ووشرەکە لەناو گەلی سەموددا

ووشترەکە لەناو ئەو خەڵکەدا زۆر جێگەی سەرسوڕمان بوو، وە هەمووکات هەموویان لێی وورد دەبوونەوە، پەروەردگاریش نیگای کرد بۆ پێغەمبەر ساڵح کە نەکەن بە خراپی مامەڵەی لەگەڵدا بکەن و عەزێت و ئازاری بدەن، وە ئاوی بیرەکانیش بکەن بە دوو بەشەوە، بەشێکیان لە ڕۆژێکدا بۆ ئاژەڵەکانی خۆتان، بەشێکیانیش لە ڕۆژێکی سەربەخۆدا بۆ ووشترەکە و وازی لێ بهێنن، تاوەکو بە چاکی بژی و شیری زۆریشتان پێببەخشێت، وە پێی دەووتن: ﴿وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ قَرِيبٌ﴾ هود (٦٤)

واتە: ئەی خزمەکانم ئەمە ووشترەکەیە کە لەلایەن خواوە کراوە بە موعجیزەو نیشانەیەکی تایبەت (لەسەر دەسەڵاتی خۆی و ڕاستی پێغەمبەرێتی من) و دەستی بۆ نەبەن، ئەگینا سزایەکی نزیک دەتانگرێت.

وە پێی دەوتن:



﴿هَـٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ الشعراء (١٥٥-١٥٦)

واته: ئەمە ووشترێکەو موعجیزەیەکە دەبێت ڕۆژێك ئاو تەنها بۆ ئەم بێت, ڕۆژێکیش بۆ ئێوە, دیاریکراوبێت, نەکەن دەست درێژی بکەنەسەرو ئازاری بدەن, بەهۆی ئەوەوە سزایەکی سەخت لە ڕۆژێکی سامناکدا یەخەتان نەگرێت.

بەم جۆرە خەڵکەکەش ڕازی بوون و ڕێکەوتن لەگەڵ پێغەمبەر ساڵح دا, ووشترەکەش بۆخۆی دملەوەڕاو ئەملاولای دەکردو لە بیرەکانیش ئاوی دەخواردەوە لە ڕۆژەکەی خۆیدا,

وە ئەوەندە سەیربوو لەهەرشوێنێکەوە بڕۆشتایە خێرا هەرچی ئاژەڵ و باڵدار هەبوو لێی دووردەکەوتنەوەو ئەوناوەیان جێدەهێشت,

وە لە هەرشوێنێکیش پشوی بدایە هیچ ئاژەڵ و باڵندەو خشۆکێك نزیکی ئەو شوێنە نەدەکەوتن و لێی دووردەکەوتنەوە..



# کۆنکرە شەیتانەکە

ووشترەکە بە ئازادی بۆخۆی دەژیاو کەسیش ئازاری نەدەدا, بەڵام پاش ماوەیەک کافرەکان هەستیان کرد کە ئەم بەڵگە گەورەیە کە لەبەرچاویانە زەرەری زۆرە بۆ ئەوان, ئەمجارەیان بیرێکی زۆر خراپ و نەگونجاو هات بە مێشکیاندا کە ئەویش بریتی بوو لەوەی خۆیان لە ووشترەکە ڕزگاربکەن و ووشترەکە لەناوببەن, چونکە دەیانووت بەڵگەی ساڵح لەسەر ڕاستێتی قسەکانی ئەم ووشترەیە, وە ئەگەر ئێمە توانیمان ئەم ووشترە لەناوببەین و بیفەوتێنین ئەوە ئەوسا دەتوانین جارێکی تریش ساڵح بەدرۆ بکەینەوە, بەڵام هەتاوەکو ئەم ووشترە زیندوبێ و لەناوماندابێت هیچ شتێکمان پێناکرێت, ئەوەبوو هەموویان کۆبوونەوە بۆ لەناوبردنی ووشترەکەو شەیتانیش هەموو ساتێ هانی دەدان کە ئەوکارە ئەنجام بدەن, وە بە وەسوەسەکانی ئەو کارە دڕندانەو ئەو کارە بەدەی لەبەرچاو جوان و شیرین دەکردن, تا ئەوەبوو هەموو بێباوەڕەکان وەسوەسەکانی شەیتانیان قبوڵ کردو هەموویان بەیەکجار بڕیاریاندا کە ووشترەکە لەناوببەن و سەری ببڕن, وە لەهەموو لایەکیشەوە خەڵکیان بۆ ئەم کارە ناشرین و ناپەسەندە هان دەدا ..



# کوشتنی وشترەکە

پاش ئەوەی هەموو لایەکیان کۆ دەنگ بوون لەسەر کوشتن و لەناوبردنی ووشترەکە پیاوە گەورەکانیان هەڵسان بە دانانی نەخشەیەکی شەیتانی بۆ جێ بەجێکردنی ئەم کارە نەخوازراوە, نەخشەکەش بریتی بوو لەوەی کە دوو پیاوی بەهێزیان دیاریکرد بۆ سەربڕینی ووشترەکە, وە بۆئەوەی قەناعەت بەو دوو پیاوە بهێنن ماڵ و سامان و ئافرەتیان بە باشترین هۆکار دانا بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئەو دوو کەسە, ئەو دوو کەسەش بریتی بوون لە:

١/قەداری کوڕی سالیف

٢/مەسرەعی کوڕی مەهرەج

پاشان بێباوەڕەکان دەستیان کرد بە کارەکانیان, سەیریان کرد مەسرەع حەزی لە کچە مامێکی خۆیەتی, بۆیە خێرا چوون بۆلای ئەو کچە ووتیان دەبێت کارێکی وای لێ بکەیت کە لەبەرخاتری تۆ ووشترەکە بکوژێت, ئەوەبوو ئەو کچەش ڕۆژێک خۆی زۆر جوان کردو چوو بۆلای مەسرەع و پێی ووت: ئەگەر بتوانیت ووشترەکە سەرببڕیت خۆمت پێشکەش دەکەم, مەسرەع زوبەزو ئامادەیی خۆی دەربڕی و بەم شێوەیە خەڵەتاندیان,



پاشان بێباوەڕەکان هاتن ئیشیان لەسەر کەسەکەی تر کرد کە ناوی قەدار بوو، بۆ ئەم مەبەستەش ئافرەتێکیان بۆ ئەمیش پێشبینی کرد کە ئافرەتێکی پیرو پەککەوتە بوو ناویشی (عونەیزە) بوو، بەڵام ئەوەی شایەنی باسکردن بێت ئەم ئافرەتە خاوەنی چوار کچ بوو، ئەم ئافرەتە پیرەشیان ڕەوانەی لای قەدار کرد، ئەویش چوو، ئەوسا بەو لاوەی ووت: ئەگەر تۆ بتوانیت ئەو ووشترە لەناوبەریت و سەری ببڕیت ئەوە لە چوار کچەکەم حەزت لە کامەیان بوو پێشکەشتی دەکەم، بەم شێوەیە ئەو لاوەشیان ڕازیکرد، پاشان هەر بەمجۆرە فێڵانە حەوت لاوی تریشیان لەخشتەبردو هەرنۆیان ئامادەکردن بۆ لەناوبردنی ووشترە خواییەکە، وەک خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿وَكَانَ فِي ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ النمل (٤٨)

واتە: لەو شارەدا نۆ دەستە هەبوو کە گوناهو تاوانیان ئەنجام دەداو تۆوی خراپەیان لە وولاتدا دەچاندو بەلای چاکەو چاکەکاریدا نەدەچوون.

لە بەیانی یەکی زوودا هەرحەوتیان لە شوێنێکدا کۆبوونەوە تاوەکو ووشترەکە سەرببڕن و لەناوی ببەن، لە شوێنێکدا بۆی



دانیشتبوون و خۆیان بۆ مەلاس دابوو، ئەوەبوو دوای کەمێک ووشترەکە لە شوێنەکەی خۆی هاتەدەرەوە، یەکسەر مەسرەع تیرێکی تێگرت و قەداری سەرسەختیش بە شمشێرێک قاچێکی پەڕاندو ووشترەکەی خست لەسەر زەوی، پاشان قەدار تیرێکی چەقاند لە ملی ووشترەکەو پاشان بە خنجەرێک ووشترەکەی سەربڕی و سەری لە لاشەی جیاکردەوە، بەم جۆرە خۆی توشی ئەو گوناهو تاوانەگەورەیە کرد، چونکە ئەو ووشترە ئایەتێک بوو لە ئایەتە سەرسوڕهێنەرەکانی پەروەردگار، خوای گەورەش لەو قەدارە توڕەیەو ئەو هەڵوێستە تاوانەشی لە قورئاندا تۆمارکرد کە دەفەرموێت:

﴿إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا﴾ الشمس (١٢)

واتە: کاتێک شەقاوەو خوانەناسترین کەسیان خۆی ڕاپسکاند (بۆ سەربڕینی ووشترەکە).

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە دەفەرموێت: (ئەو پیاوە) پیاوێکی داپۆشەر و بەهێز و خاوەن شەهامەت بوو لەناو هۆزەکەیدا، وە (لە دەسەڵات و زۆری کەس و کاردا) وەکو ئەبی زەمعە وابوو . (أحمد)

وە ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبی تالیبی بانگ کرد و پێی فەرموو: ئایا قسەت بۆ بکەم دەربارەی خراپترین کەس لە ناو



خەڵکیدا؟ (ئیمامی عەلیش) وتی: بەڵێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دوو کەسن:

یەکەمیان ئەو پیاوە سورکەلە بوو کە لە قەومی سەموددا وشترەکەی سەربڕی، دووەمیشیان ئەو کەسەیە کە دەدات لە سەری تۆ و بەهۆی زۆری خوێنی سەرتەوە ریشت بە خوێن تەڕ ئەکات. (ابن أبی حاتم)

وە دەڵێن ئەو پیاوە قەدار سالیفی باوکی بەهۆی زیناوە قەداری بووە و قەداری کوڕی بەرەی زینا بوە..

پێش ئەوە ساڵح پێغەمبەر زانی بەتەمای کوشتنی وشترەکەن بۆیە زوو بە زوو ئاگاداری کردنەوە و پێی وتن : نەکەن نزیک بینەوە لە کاری وا نابەجێ و ناڕەوا، بەڵام ئەوان گوێیان نەدایە قسەکەی و وشترەکەیان سەربڕی.

خوای گەورەش دەفەرموێت ﴿فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ الأعراف ٧٧

واتە: یەکسەر چوون وشترەکەان سەربڕی و لە فەرمانی پەروەردگاریان یاخیبوون وتیان: ئەی ساڵح ئەگەر تۆ لە پێغەمبەرانیت ئادەی ئەو هەڕەشانەی کە لێمان دەکەیت بۆمان پێش بهێنە.



# دەربازبوون...سزا

ئەو نۆ دەستەیە لەدوای کوشتنی ووشترەکە هەر وازیان نەهێناو ئەمجارەیان پیلان و نەخشەیان کێشا تاوەکو پێغەمبەر ساڵح بکوژن، بۆئەوەش لەناو ئەشکەوتێکدا خۆیان مەڵاسدا، چاوەڕێی ئەوەبوون کە پێغەمبەر ساڵح سەلامی خوای لێ بێ بەبەردەم ئەشکەوتەکەدا بێت و ئەمانیش خێرا هەڵکوتنە سەری و بیکوژن، بەڵام پێش ئەوەی پێغەمبەر ساڵح بگاتە لای ئەشکەوتەکە بە فەرمانی خوای باڵادەست کێوەکە ڕما بەسەریانداو هەرلەوێدا هەر نۆیان مردن، خوای خۆشەویست لە قورئانی پیرۆزدا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

﴿قَالُواْ تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ۝ وَمَكَرُواْ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ۝ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَٰهُمْ﴾ النمل (٤٩-٥١)

واتە: هەموویان سوێندیان بە خوا بۆ یەکتر خوارد کە لە شەودا بدەن بەسەر ساڵح و ماڵ و منداڵیداو لەناویان بەرن، پاشان(ئەگەر گومانیان لێکردین) سوێند دەخۆین و بە کەس و کاری

دەڵێین: ئێمە ئاگامان لە تیاچوونی ئەوان نیەو دڵنیابن ئێمە ڕاستگۆین.

(ئەو تاوانبارانە) پیلان و تەڵەکەیان گێڕا (بۆ لەناوبردنی صاڵح و شوێنکەوتووانی) ئێمەش نەخشەیەکی ترمان کێشا (بۆ ڕزگارکردنی ئیمانداران و لەناوبردنی خوا نەناسان) ئەوان ئاگایان لێ نەبوو، هەستیان پێ نەدەکرد جا ئیتر سەرنج بدە و تەماشاکە، سەرەنجامی پیلانەکەیان چیان بەسەرهات، بەڕاستی ئێمە ئەوانمان لەناوبرد.

پاشان خوای گەورە نیگای کرد بۆ پێغەمبەر صاڵح کە دوای سێ ڕۆژی تر سزای خودا دەبارێتە سەریان، پێغەمبەر صاڵحیش سڵاوی خوای نەعەرزی پێی ڕاگەیاندن و ئاگاداری کردنەوەو فەرمووی

﴿تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴾

هود (٦٥)

واتە: ڕابوێرن لە ماڵ و مەنزڵی خۆتاندا بۆماوەی سێ ڕۆژ (دوای ئەو ماوە دیاری کراوە تیادەچن) و ئەوەش پەیمانێکەو هەرگیز بە درۆ ناخرێتەوە.

پاشان پێغەمبەر صاڵح و ئەو کەسانەی ئیمانیان پێهێنابوو ئەو ناوچەیان بەجێ هێشت تاوەکو سزاکە نەیانگرێتەوە، بەڵام لەوکاتەشدا بێباوەڕەکان لە قسە ناشرینەکانی خۆیان نەدەکەوتن و

گاڵتەیان دەکرد بە پێغەمبەر صالح و ئیماندارەکان، ئەوەبوو پێغەمبەر صالح و ئیماندارەکان دوورکەوتنەوەو ڕۆیشتن، ئەوسا خەڵکی بێباوەڕی ئەو ناوچەی سەمودە لە ڕۆژی یەکەمدا دەموچاوەکانیان زەرد هەڵگەڕا.

لە ڕۆژی دووەمیشدا دەموو چاوەکانیان سوور داگیرسا، لە ڕۆژی سێیەمیشدا کە ڕۆژی سزاکەبوو دەموو چاوەکانیان ڕەش ڕەش بوو، پاشان لە ئاسمانەوە دەنگێکی زۆر دژوارو سامناک و ترسناک بەرەو ڕوویان بوویەوە و هەموویان زنوقیاچو، ئەوسا ڕۆح لە لاشەیاندا نەماو هەموویان مردن..

خوای کردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَٰلِحًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَمِنْ خِزْىِ يَوْمِئِذٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ ۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَا۟ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ﴾ هود (٦٦-٦٨)

واتە: جا کاتێک فەرمانی ئێمە هات و بڕیاردرا لەکاتی دیاری کراوداو ئەوە صالح و ئەوانەی بڕوایان هێنابوو



لەگەڵیدا ڕزگارمانکردن بە میهرەبانی و بەزەیی خۆمان, لە سەرشۆڕیی ئەو ڕۆژەش پەنامانداد, بەڕاستی پەروەردگارت هەرخۆی خاوەنی هێزەو باڵادەستە.

جا ئەو دەنگە سامناکەی بووە هۆی تیاچوونیان هەموو ئەوانەی گرت کە تاوان و ستەمیان کرد و فەرمانبەرداری پەروەردگاریان نەبوون, سەرەنجام هەموویان لە شوێنەکانی خۆیاندا کەوتن بەڕووی زەویداو تیاچوون لە بەرەبەیاندا.

وەک ئەوەی کە هەر لەوشوێنە نەبووبن و تیایدا نەژیابن, ئاگاداربن, بەڕاستی هۆزی ثمود بێ بڕوا بوون بە پەروەردگاریان و بێ وەفا بوون بەرامبەری, ئاگاداربن بڕیاری دووری لە بەزەیی خوا, درا بۆ هۆزی ثمودیش.

پەروەردگارا: بە گوناهو هەڵەی خۆمان لەگەڵ مەکە و لە تاوانەکانمان خۆشببە،



خوایە گیان لە ژیاندا توشی تاقیکردنەوەیەکمان مەکە کە نەتوانین لە بەرامبەریدا رابوەستین و یارمەتی و کۆمەکیمان بکە بۆ هەموو قسە و کارێکی خێر و چاکە.

خوایە گیان هەموو کات ترسی خۆت لە ناو دڵماندا بڕوێنە...آمین... آمین

وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ

٢٠٠٩/٤/٩

والسلام عليكم و رحمة الله



